


# سەرکەوتنت



# پیرۆزە



بابەتێکی تایبەت بە تاقیکردنەوەکانی کۆتایی ساڵ

# سەرکەوتنت پیرۆزە

ئامادەکردن و وەرگێڕانی لە

عەرەبی‌یەوە بەدەستکاری‌یەوە


بەشی ڕۆشنبیری

کۆمەڵەی ئارا بۆ توێژینەوەی زانستی



٢٠٠٧




۞ ناوی کتێب: سەرکەوتنت پیرۆزە.

۞ ئامادەکردن و وەرگێڕانی: بەشی ڕۆشنبیری کۆمەڵەی ئارا.

۞ نووسینی: د.سلمان فهد عودة.

۞ ژمارەی سپاردن: ۳۹۰ی ساڵی ۲۰۰۶

۞ چاپی: سێیەم



Arastudy@yahoo.com

بسم الله الرحمن الرحيم

**پێشەکی:**

ئـەو مرۆڤـەی کـە خواسـتێکی ڕاسـتەقینەی هەیـە، بێگومان لـە کۆتاییدا پێی دەگات؛ چونکە هەوڵـدان و کۆڵنەدان دوانەی هەموو کەسێکی سەرکەوتوەو لەگەڵ مرۆڤی شکست خـواردوودا هـەڵناکات.شـایانی باسـە لەمرۆدا کوڕان و کچانمان ڕۆژگەلێکی سـەخت و پـڕ دڵەڕاوکێ دەگوزەرێنن، کە پێویسـتی بـە هۆشـیاری و چاودێری دایکان و باوکـان هەیـە بـۆ تێپەڕانـدنی ئـەم قۆناغە بەسەرکەوتوویی.

## چۆن بەسەر دڵەڕاوكێی خوێندندا زاڵ دەبیت؟

١. ئاسوودەبە لە پێشوازی ڕۆژانی ژیانتداو گیرۆدەی غەم و پەژارە مەبە.

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَفِي السَّمَاء رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ﴾الذاريات/ ٢٢

٢. هەوڵ وكۆشش و ماندوێتی عەقڵ و لاشەت لەیاد مەكە.

٣. بیر لە كەوتن و شكستی ڕابردوو مەكەرەوە، ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرت(ﷺ)لەیاد بێت كەدەفەرموێت (ئەگەر ڕووداوێكت تووش هات مەڵێ ئەگەر فلان كارم بكردایە ئەوا واو ئاوا دەبوو، بەڵكو بڵێ ئەمە ویستی خوای گەورەیەو هەرچی بیەوێت

دەیکات چونکە وشەی(ئەگەر) دەرگا بەرووی کاری شەیتاندا دەکاتەوە).

٤. رازی‌بە ویستی پەروەردگار... ئەوەی خوای گەورە بۆت بریار دەدات لەوە باشترە کە خۆت هەڵی دەبژێریت، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ( چەند جوان و رێك و پێکە بەسەرهات و رووداوەکانی ژیانی مرۆڤی باوەردار، چونکە تووشی هەرچی بێت هەر خێرە بۆی، وە ئەمەیش تەنها بۆ باوەردارانە چونکە باوەردار ئەگەر تووشی خۆشی بوو سوپاسگوزارەو خواش پاداشتی ئەداتەوە وە ئەگەر تووشی ناخۆشی و دەردو بەلا بوو ئارام دەگرێت و ناشوکری ناکات، خواش پاداشتی خۆراگرتنی بەباشە ئەداتەوە

٥. لە جیاتی ژماردنی خەم و شکستەکان بەخششەکانی خوای گەورە بژمێرە، کەلە ژمارە نایەن...!

٦. خوت بەکاری لاوەکی و بچوکەوە خەریك مەکە، چونکە شایەنی ئەو گرنگیدانە نیيە.

٧. خوپەرست مەبە کەتەنها لەبیری خوت دا بیت، بەلکو هەول بدە کەلە خزمەتی دەوروبەرەکەتدابیت و سوودیان پی بگەیەنیت

٨. هەولی تولەسەندنەوە مەدە لە دوژمنەکانت بەجێیان بهێلە تا بە سزای خویان دەگەن

٩. چوك دامەدە لەبەردەم گریکوێرەی هەستکردن بەناوایی رابەردوو، لە پیوست و پەشیمانی لە رابردوو،

چونکە خوای گەورە بەخشندەیەو لـەتاوانی بەنـدەکانی خۆش دەبێت.

## دڵەڕاوکێی بە سـوود و بەرهـەم هـێن و دڵـە ڕاوکێی ڕوخێنەر:

پێویستە جیاوازی بکەیت لە نێـوان دڵـەڕاوکێی بـە سوودو بەرهەم هێن کـە هاندەرتـە لەسـەر خوێنـدن و ڕێکخستن و لـەبەرکردن و جێبـەجێ‌کردنی ئەرکـەکان وە دڵەڕاوکێی ڕوخێنەر، کەلە کات و عەقڵ و ڕۆحت دەبات، وەلە خـەوو خـواردن و خوێنـدن و کۆشـش دوورت دەخاتەوە.

* کاتی گونجاو بۆ خـەوتن و پشـوودان دابـین بکـە بەتایبەتی لە شەوانی تاقیکردنەوەدا.

*گرنگی بدە بە بڕی پێویست بە تەندروستیت، بڕی پێویست خواردن بخۆ بەتایبەت ژەمە خۆراکی سووك و ئاوی میوە بەبێ زیادەڕەویکردن... وە خواردنەوەی قاوەو چا و هاوشێوەکانی کەم بکەرەوە، ئەوەشت لەیاد نەچێت کە خواردنی حەبی وریاکەرەوە لەناوبەرو زیان بەخشەو پێویستە لێی دوور بکەویتەوە تەنانەت لە وەرزی تاقیکردنەوەشدا.

*بەهۆی سەرقاڵ بوونت بە (خوێندن)ەوە جوڵەو وەرزشی ڕۆژانە لەیاد مەکە.

*یادی پەروەردگارت بکە ﴿الَّذِينَ آمَنُواْ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ اللّهِ أَلاَ بِذِكْرِ اللّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾ الرعد/ ٢٨.

*پشت بەخوای گەورە ببەستەو هاوکات هۆکارەکانیش فەرامۆش مەکە.

## سەرکەوتنت پیرۆزە

*ژیــان هــەمووی تاقیکردنەوەیــە، هــەروەك چــۆن پێویستە لە تاقیکردنەوەی خوێندندا ســەرکەوتوو بیــت، پێویستە لە تاقیکردنەوەی ژیانیشدا ســەرکەوتوو بیــت؛ چــونکە ژیــان هــۆڵی تاقیکردنــەوەو تەمــەنیش کــاتی تاقیکردنەوەیە! ئەنجامەکانیش لە کۆتاییدا دەردەکەون

## سەرکەوتننت پیرۆزە

**تاقیکردنەوە:**

بریتیە لە پێوەری ئەوەی کە خوێندوتەو فێری بوویت لــە کــاتێکی دیــاریکراودا، نــەك تارماییــەکی ترســناك. کەواتە قوتابی ئازیز ئارامبگرەو هێوربە بۆ ئەوەی توانات بشکێ بەسەر سەعیکردن وپێداچوونەوەی وانەکانتدا و خوێندنەوەکـــەت بەرهەمـــداربێت و ئەنجامەکـــەت خوازراوبێت کە بریتیە لە سەرکەوتن و دەرچـوون( بـە پشتیوانی خوای گەورە).

## خـۆ ئامـادەکردن بـۆ تاقیکردنـەوە و چـەند ڕێنماییەك:

١ .سەرەتای خوێندن بەناوی خوا دەست پێ بکە.

٢ . بەشـــێوەیەکی دروســـت دابنیشـــە لـــەکاتی کۆششکردندا تا دووربیت لە خەواڵوی و تەمەڵی.

٣ . ئیشـەکانت دوا مەخـە، بـۆ ئـەوەی لـە ژیانتـدا تووشی شکست نـەبیت، بـەڵکو چوسـت و چـالاکانە کارەکانت جێبەجێ بکە.

٤ . لە زۆر خواردن دووربکـەوەرەوەو ئاگـات لـە کاتەکانی پشوودان بێت.

٥ .دووربکەوەرەوە لەشـەونخونی و خۆمانـدوکردنی زیاد لە پێویست بۆ ئـەوەی بتوانیـت بەباشـی ئامـادەی تاقیکردنەوەکان بیت.

## سەرکەوتنت پیرۆزە

أ. ئەوەش بزانە کە کاتی بەیانی بە تایبەتی دوای نوێژی بەیانی باشترین ماوەیە بۆ کۆششکردن، پێغەمبەر(ﷺ) مژدەمان پێ دەدات کە نوێژی بەیانی دەبێتە مایەی دڵ ئاسودەیی وسنگ فراوانی و دوورخستنەوەی شەیتان.

ب. هەردەم لە یادت بێت کە سەرکەوتن لەلایەن خواوەیە، بۆیە داوا لە خوای گەورە بکە کە پشتیوانت بێت.

ج. هەمیشە ئەو ڕاستیەت لە پێش چاوبێت کە زانست پەرستشەو هەر بەو گیانەوە تێبکۆشەو بخوێنە.

**ئـەو ئامانجانـەی لـەکاتی خوێندنـەوەدا هـەوڵی بەدیهێنانیان دەدەین بریتین لە:**

١.تێگەیشتن.

٢.لەبەرکردن.

٣.چەسپاندنی زانیاریەکان.

بەهەوڵـدان لـە پێنـاوی ئـەم ئامانجانـەدا دەتوانیـت زۆرترین کات وانەکانت لەیاد بێت و لە ژیانی کرداری و هەموو تاقیکردنەوەکاندا سوودیان لێ وەربگریت.

**ئەو بنەما بنچینەییانەی کە ئەم ئامانجانە دەهێننە دی:**

**یەکەم: خوێندنەوەی هەموو وانەکە:**

هەندێك قوتـابی لەسـەرتاوە زۆر بـەوردی و چـڕی وانەکان دەخوێننەوە تا لە کۆتاییدا ناتوانن زاڵ بن بەسەر هـەموو وانەکانـداو دوا دەکـەون لـە پێداچـونەوەی وانەکان و خۆئامادەکردن بۆ تاقیکردنەوە.

## سەرکەوتنت پیرۆزە

*بۆ دوورکەوتنەوە لە هەڵەی لەم جۆرەو خوێندنەوەی گشتگیری وانەکە پێویستە

- ناونیشانە سەرەکیەکانی وانە بە باشی لەبەربکەیت: لەبەرکردنی ئەم ناونیشانانە دەبێتە هاندەرێکی باش بۆ زیاتر شارەزابوون وتێگەیشتن لە بابەتەکە.

- لەبەرکردن و وتنەوەی ناونیشانە لاوەکیەکان و پێداچونەوەی ناونیشانە سەرەکیەکان.

- خوێندنەوەی خێرای هەموو وانەکە: ئەم خوێندنەوە خێرایە سوودبەخشە لە خێرا تێگەیشتنی بابەتەکەدا هەروەك هاندەرە لەسەر خێرا لەبەرکردن و زاڵ بوون بەسەر پەرش وبلاوی بیروهۆشدا.

- گرنگی دان بە وێنەی ڕوونکردنەوەو ناسینەوەی لەکاتی خوێندنەوەی خێرادا.

- خوێندنەوەی پوختەی وانەکە.

## دووەم: تێگەیشتن و لەبەرکردن:

خوێندنـەوەی گشـتگیری وانەکـە یارمەتیـدەرە لــە بەیەکەوە بەستنەوەی بەشەکانی بابەتەکە، بەڵام لــەکاتی خوێندنــەوەدا بەمەبەســتی لەبــەرکردنی زانیاریــەکان پێویستە پەیڕەوی ئەم خاڵانەی لای خوارەوە بکەیت:

١.لە خاڵە بنەڕەتیـەکانی وانەکـە تێبگـەو هێـڵ لــە ژێریان دابنێ، وە دووبارە بیانخوێنەرەوە.

٢.تێگەیشتنی ڕێســاو بنــەماو هاوکێشـەو بـیردۆزەو هاوشێوەکانیان بەباشی، پاشان لەبەرکردنیان.

٣.لەبەرکردنی وێنـەو هێڵکاریـەکان و خۆڕاهێنـان لەســەر کێشـانیان لەگـەڵ نووسـینی بەشـەکان لەسـەر وێنەکە.

٤.دڵنیابە لەوەی کە بەتەواوی لەوانەکە تێگەیشتویت بە شێوەیەك کە بتوانی وەڵامی پرسیارەکانی کۆتایی ئەو بەشە بدەیتەوە.

٥. هەوڵبدە پرسیار لەسەر بەشەکانی وانەکە دابنێیت و بەدوای وەڵامی ڕاستدا بگەڕێیت بۆیان.

٦.ئەو بابەتانەی کە پێویستی بە خوێندنێکی چڕوپڕ هەیە پێویستە بکرێت بەچەند بەشێکەوە، بەمەرجێك هەر بەشەو ماناکەی ڕوون و ئاشکرا بێت و پەیوەندی بە بابەتە بنچینەیەکەوە هەبێت.

٧. لەکاتی کۆششکردندا مەترسە و متمانەت بە خۆت هەبێت، بە خێرایی بابەتەکان لەبەر بکە، بە خۆڕاهێنان لەسەر ئەم شێوازە دەتوانیت هەموو ئەو بابەتانەت بێتەوە یاد کەلەبەرت کردوون.

٨. ناوبەناو بابەتەکان لەبەربکە بەو شێوەیەی کە پێت وایە بەکاری دەهێنی.

٩. پێویستە پێش دەستپێکردن بەلەبەکردنی بابەتێك بە دەنگێکی بیستراو بیخوێنیتەوە تا بیروهۆشت جەم بێت و خێرا لەبەری بکەیت.

١٠.لە کۆتایی کۆششی ڕۆژانەداو ڕاستەوخۆ پێش خەوتن بەو بابەتانەدا بچۆرەوە کە خوێندوتن، چونکە پشوودان و خەوتن یارمەتیدەرن لەسەر چەسپاندنی زانیاریەکان لە بیرهۆشدا بەباشی.

**وەڵامدانەوە:**

١ .قوتابی دەتوانێت خۆی پرسیار بنووسێت وەك مامۆستای وانە، پاشان هەوڵی وەڵام دانەوەیان بدات، هەروەك ئەکرێت پرسیاری ساڵانی ڕابردووی مامۆستای وانە بەدەست بهێنێت بۆ ئەوەی شارەزای شێوازی مامۆستا بێت لە دارِشتنی پرسیاردا.

٢ .پێش چوون بەرەو تاقیکردنەوە ژەمە خۆراکی بەیانی لەیاد مەکە هەرچەندە کاتیشت کەم بێت.

٣.ئاگات لە خشتەی تاقیکردنەوەکان و کاتی دەستپێکردنیان بێت.

٤ . پشت بە خوای گەورە ببەستەو یادی بکە، باناوی خوا دەستپێکی هەموو کارەکانت بێت.

٥.پێویستە لەکاتی دیاریکراودا ئامادەی تاقیکردنەوە بیت و هەموو پێداویستیەکانت لەگەڵ خۆتدا بردبێت.

٦. بە هێواشی پرسیارەکان بخوێنەرەوە، وە لەهەر پرسیارێك تێنەگەیشتی داوا لە مامۆستا بکە تا بۆت ڕوون بکاتەوە.

٧. بە وەڵامدانەوەی پرسیاری ئاسان دەست پێ بکە بۆ ئەوەی کات بە فیڕۆ نەدەیت.

٨. وەڵام دانەوەی ئەو پرسیارانەی کە نایانزانیت دوابخە بۆ کاتێکی دی و دوو دڵ مەبە بەهۆی ئەو دواکەوتنەوە.

٩.گرنگی بدە بە جوانی و ڕێکوپێکی نووسین و بە پێی توانا لە زۆر کوژاندنەوە دوور بکەوەرەوە.

١٠. لـــە قـــۆپیکردن و فێـــڵ و خەڵەتانـــدن دوور بکەوەرەوە چونکە کارێکی ناپەسەندو قەدەغەکراوە.

١١. کـاتی دیـاریکراو بـۆ شـیکاری پرسـیارەکان دابەش بکە بـە شـێوەیەکی پەلـە بەرەچـاوکردنی بـڕی نمـرەی دیـاریکراوی هـەر پرسـیارێك، بەشـێوەیەکی کورتیش لەسەر پەڕاوی پرسیارەکان بە پێنووس وەڵامی پرسیارەکان بدەرەوە.

١٢. پەلە مەکە لە وەڵامدانەوەو چوونەدەرەوە لـە هۆڵی تاقیکردنەوە بەڵکو بـە وەڵامەکانتـدا بچـۆرەوەو جارێکی دی پرسیارەکان بخوێنەرەوە بـۆ ئـەوەی دڵنیـا بیت کە هیچ بڕگەیەکت بەجێ نەهێشتووە بەبێ وەڵام.

١٣. هیچ پرسیارێك بەبێ وەڵام بەجێ مەهێڵە، ئەگەر وەڵامی تەواویشت لا نەبێت ئەوا بۆچون و شیکاری خۆت بخەرە ڕوو لەو بارەیەوە.

## قۆپیکردن:

قۆپیکردن و فێڵکردن پەردە لە ڕووی فەرامۆشی و بێباکی قوتابی هەڵدەماڵێت لە میانەی ساڵی خوێندندا.

لەوەرزی تاقیکردنەوەکاندا هەڵسوکەوتی نابـاو ڕوو لە زیاد بوون دەکات؛ بەهۆی باری نایاسایی وەکو دڵەڕاوکێ و ترس لەپرسیارەکان و قورسی هەندێ لە وانەکان قوتابیان گرفتاری هەندێ هەڵسوکەوتی‌نەشیاو دەبن وەکو هاوارکردن و قسەکردن بەدەنگی بەرزو پەیڕەونەکردنی ڕێساکانی قوتابخانە، سەرەڕای پەنابردنەبەر قۆپیکردن یان هەڵگرتنی کاسێت و

گۆڤاری جۆراوجۆررو بە گژداچونەوەو هەڵگەڕانەوە لە مامۆستایان و گوێڕایەڵی نەکردنیان.

دەبێت ئەوەشمان لەیاد نەچێت کە ئەم هەڵسوکەوتانە هەمرو قوتابیان ناگرێتەوە چونکە زۆر قوتابی سەرکەوتووش هەن کە سوورن لەسەر هەوڵدان و کۆشکردن.

**هەندێك لەو هۆکارانەی کە پاڵ بە قوتابیەوە دەنێن پەنا بەرێتە بەر قۆپیکردن:**

١. گرنگی نەدانی قوتابی بە خوێندن و کۆششکردن بە درێژایی ساڵ سەرباری ئاڕاستەکردنی لەلایەن مامۆستاو ئەندامانی خێزانەوە.

٢.تەمەڵی و لاوازی توانای وەرگرتنی زانیاری لەلایەن قوتابیەوە و جوان سەرنج نەدان لە شیکردنەوەی مامۆستا لە پۆلدا

٣. پێدانەچونەوەی وانەکان لەشەوی تاقیکردنەوەدا.

٤. نەبوونی ئامادەیی لە هۆڵەکانی خوێندنـدا بەدرێژایی ساڵ کە دەرەنجام لە پرۆسەی خوێندن دوا دەکەوێت.

٥. لە ئەنجامی ترس لەکەوتن یان سزادان لەلایەن خێزانەوە.

٦. نەزانینی گرنگی کرداری فێرکردن لەلایەن قوتابیەوە.

٧. نەبوونی چاودێری وئاگادارکردنەوە لەلایەن ماڵ و قوتابخانەوە.

* دیارە ئەم حاڵەتەش پێویستە بەشێوەیەكی زانستیانە چارەسەر بكرێت بە بنەبڕكردنی هۆكارەكانی و ڕەچاوكردنی باری دەروونی قوتابیان لەكاتی تاقیكردنەوەكاندا.

هەروەك پێویستە بەڕێوەبەرایەتی قوتابخانەكان شوێنی گونجاوو هەموو پێداویستەكانی تاقیكردنەوە دابین بكەن. سەرەڕای ڕێنمایكردن و هۆشیاركردنەوەی قوتابیان سەبارەت بە شێوازی ئەنجامدانی تاقیكردنەوەكان و ئامادەكاری پێویست لەو بارەیەوە.

هەندێك قوتابی تەنها لە ڕۆژەكانی كۆتایی وەرزی خوێندندا دەست دەكات بە خۆ ئامادەكردن بۆ تاقیكردنەوەكان كە دەبێتە هۆی تووش بوون بە دڵەڕاوكێ، لە كاتێكدا قوتابی چالاك و سەركەوتوو

هــەر لەســـەرەتاوە کۆشـــش دەکـــات و خـــۆی بـــۆ تاقیکردنەوەکان ئامادە دەکات.

## دە کلیلی سەرکەوتن لە خوێندندا

### ١.خواست گەنجینەیەکە لەناوناچێ:

کەسێك هەوڵ نادات بۆ سەرکەوتن گەر خواســت و ئــاواتی نــەبێت، لەبــەر ئــەوە خواســت بریتیــە لــەو گەنجینەیەی کە دوایی نایەت. با خواستی بەرزت هەبێت و هەمیشە لــە لوتکــە بڕوانــە..ئــەوە ( عمــری کــوڕی عبـــدالعزیز)ە ، کـــەدەربارەی خواســـتە بـــەرزەکانی ئەفــەرموێ: نەفســێکی گــەرم هەیــە، هیــوای میرنشــینی خواست و بەدەستی هێنا، وە هیوای خەلافەتی خواست هەر بەدەستی هێنا، وە من ئێستا هیوای بەهەشــتم هەیــە داواکارم بەدەستی بهێنم.

## ٢. بەخشین یەکسانە بە وەرگرتن:

سەرکەوتن ئیش و هەوڵ و تێکۆشـان و ئارامگرتنـە، کەواتە هەوڵ بدە و تێبکۆشە بـۆ هێنانـەدی خواسـت و ئامانجەکانت.

لـە بیرت بێ ئەوەی تێبکۆشـێ دەبینێتـەوە و ئـەوەی بچێنێ دەدورێتەوە.

## ٣.تێڕوانینت بگۆڕە بەرامبەر بە خۆت:

مرۆڤ خاوەن تواناو هێزی زۆری شـاراوەیە پێویسـتی بەوە هەیە کـە تـەپ وتـۆزی کەمتەرخـەمی و تەمـەڵی لەسەر لابرێ..تۆ زۆر بەتواناتری لەوەی کە چاوەڕێی ئەکەی زۆر بەهێزتری لەوەی کە بەخەیاڵتا دێت وەزۆر زیرەکتری لەوەی کەبڕوات پێی هەیە...

هـەموو وشـەیەکی نـەرێ بسـڕەوە لـە ناختـدا وەك ( نـاتوانم – زیـرەك نـیم) بـەردەوام ئـەم دەسـتەواژانە

بلێرەوە ( من شایستەی باشترم- من داهێنەرم- من زۆر باشم- من ئەتوانم...).

## ٤.سەرکەوتن ئەوەیە کە دروستی ئەکەیت:

( بیر لە سەرکەوتن بکەرەوە- حەزم لە سەرکەوتنەو خۆشم دەوێ).

سەرکەوتن هەستێکی تایبەتە، گەشتی مرۆڤی سەرکەوتوش بە خۆشەویستی سەرکەوتن و بیرکردنەوە لێی دەست پێ دەکات... بیر بکەرەوەو خۆشت بوێ وە گەشتەکەت دەست پێ بکە بەرەو ئامانجت.. لە بیرت بێت:

(سەرکەوتن لە باری دەروونی تاکەوە دەست پێ دەکات، پێویستە بڕوات بەوە هەبێ کە سەردەکەوی- بەیارمەتی خوا بۆئەوەی بە ڕاستی سەرکەوتنت بۆ بنوسرێ.)

سەرکەوتووەکان بە دەسەوەسانی و دانیشتن سەرنەکەوتوون، وە چاوەڕێی سەرکەوتن ناکەن و بڕوایان بەوە نیە کە هەلێکی چارەنووسە بەڵکو دروستی دەکەن بە کارو دڵسۆزی و بیرکردنەوەو خۆشەویستی و قۆستنەوەی هەلەکان وپشت بەستن بەوەی کە بەدەستی خۆیان بەدەستی دەهێنن.

**٥.شکست تەنها ڕووداوێکە.. لە هەمان کاتیشدا ئەزموونە:**

لە شکست مەترسە بەڵکو بیقۆزەرەوە بۆ ئەوەی ببێ بە پەند بۆت بەرەو سەرکەوتن کەس سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە تا لە قوتابخانەی سەرکەوتن فێرنەبوبێت..

ئەدیسۆن داهێنەری کارەبا( ١٨٠٠) هەوڵی سەرنەکەوتووی ئەنجامدا پێش داهێنانە گەورەکەی.

هیچ نائومێد نەبوو لەو هەوڵە شکستخواردووانەی کە بە ئەزموون دایدەنان کە تیایاندا فێری بنچینەی زانستی بوو وە بەهۆی ئەو هەوڵانەوە توانی گڵۆپی کارەبایی دابهێنێ.

بیرت نەچێ: تەنها کەسێك شکست ناهێنێ کەکار نەکات..ئەگەر شکست نەهێنی ڕێگا نایدۆزیتەوە.. شکست هەل و ئەزموونە..لە شکست مەترسە وە لێ مەگەڕێ کە هەوڵی شکستخواردوو تووشی ڕووخانت بکات..

شکست هیچ نیە جگە لە کشانەوەیەکی کاتی هەلی سەرکەوتنت بۆ دروست ئەکات.

## ٦-با ناخت لێوان لێو بێت لە باوەڕو هیوا:

باوەڕ بە خوای گەورە بناغەی هەموو سەرکەوتنێکە، ئەو ڕووناکیەیە کە ڕێگای خاوەنەکەی ڕۆشن

دەکاتـــەوە، پێوانـــەی ڕاســـتەقینیە بـــۆ هەڵبـــژاردنی سەرکەوتنی ڕاستەقینە.. باوەڕ هێزت پـێ دەبەخشـێت، بریتیە لـە سەرەتاو خاڵی دەستپێکردن بەرەو سەرکەوتن، ئەو وزەیەیە کە دەتبات بەرەو سەرکەوتن..

هیوا ئەو خەونەیـە کـە سـەرکەوتنمان بـۆ دروسـت ئەکات، گەشتی سەرکەوتن بە هیوا دەست پێ دەکـات ئینجا لـەگەڵ هەوڵ و کۆشش ئاواتەکان دێنە دی.

## ٧- بـــەهرەکانت دەربخـــەو کـــەڵکیان لێ وەربگرە:

هەموو مرۆڤێك بەهرەو و هێزی نـاوەکی هەیـە کـە پێویـــتە کاریـان لەســەر بکـەین و دەریـان بخـەین و گەشەیان پێ بدەین، ئەوانیش وەك داهێنان و زیرەکی و بیرتیژی و خوێندنەوەو یادگەی بەهێز.. وە ئەتوانین کار لەســەر پاراســتنی ئـەم بەهرانــە بکــەین و کــەڵکیان

لێوەربگرین لەجیاتی ئەوەی بە لـەکارخراوی بمێنێتـەوە لە ژیانماندا.

## ٨- چێژوەرگرتن لـە خوێنـدن.. ڕێگەیـە بـۆ سەرکەوتن:

قۆناغی خوێندن لە بەچـێژترین قۆناغـەکانی ژیانـە، کەسیش چێژی نازانێ مەگەر کەسێك نەبێت کە پێیـدا تێپەڕیبێت وبەوانەی پێش خۆی گەشـتبێ وەخوێنـدن و فێربوون چێژی هیچ شتێکی تری پێ ناگاتەوە لە ژیاندا بەتایبەتی ئەگەر گـرێ بـدرێت بەپەرستشـەکانەوە لای خاوەنەکەی.

جا چەندە جوانە کاتێ چێژی زانست گرێ دەدرێ بـە چێژی پەرستشەوە..خوێندن و گەڕان بە دوای زانستدا چێژێکی هەمیشەیی‌یە کە بەسەرکەوتن کۆتایی دێت.

**٩- سەرکەوتووەکان هەمیشە بڕوایان بەتواناکانیان هەیە بۆ سەرکەوتن:**

بڕوابوون بەسەرکەوتن واتە هاتنە ناو مەیدانی سەرکەوتن بە ئیرادەیەکی بەرزەوە، وە ئەوەی بڕوای بە خودی خۆی نیە بە شکست خواردوویی دەچێتە مەیدانی جەنگەوە.

**١٠- سەرکەوتن و دەرچوون= ١٪ ئیلهام و خەیاڵ+ ٩٩٪ هەوڵ و تێکۆشان:**

ئیلهام و خەیاڵ زیاتر لە ١٪ی سەرکەوتن پێکناهێنێ لە کاتێکدا ڕێگەی ڕاستەقینەی سەرکەوتن بریتیە لە بەکاربردنی هەوڵ و تێکۆشان وە ئەوەی بەدەستی دەهێنیت بەبێ هەوڵ و ماندووبوون و بایەخدان هیچ مانایەکی نیە، بەکاربردنی هەوڵ و تێکۆشان نۆ لەدەی سەرکەوتنە.

## چەند ئامۆژگاریەك بۆ خوێندنەوەو كۆششكردن له وانەكانت:

### زمانی كوردی:

١. خوێندنەوه و نووسین: باشترین ڕێگه له ئاخاوتن و دەربڕیندا بریتیه له زۆر خوێندنەوەی ئەو بابەتانەی پەیوەندیان بەبەها بالاکانی مرۆڤایەتی و ژیانی کۆمەلایەتیەوه هەیه...

باشتر وایه هەموو ئەو دەستەواژەو بیژانه تۆماربکەیت له دەفتەری تێبنی‌یەکانتدا کەلە بابەتەکانی خوێندندا پێویستت پی‌یان دەبێت، پاشان هەولبدە لەچەند بابەتێکی جیاجیای پەیوەندیدار بە بوارەکانی ژیانەوە بنووسیت وەکو ڕووداو و بابەتە گشتی‌یەکان، وە پێویسته له کاتی نووسیندا ڕەچاوی دەستنیشانکردنی بیرۆکەکان و ڕیزبەندیان بکەیت ئەویش بە:

- دابەشکردنی بابەتەکە بۆ چەند بەشێکی ڕێکخراو و ڕوون، وە لە هەر بەشێکدا بیرۆکەکە ببەسترێتەوە بە بەشەکەی پێش و دوای خۆی.

- ڕەچاوکردنی بنەماکانی ڕێزمان، چونکە ئەوە بابەتێکە ناکرێ دەستبەرداری ببیت وە ڕوودانی هەڵە تیایدا نەخوازراوە.

- دەرنەچوون لە بابەتەکەو نەخستنە سەری زیادەیەك کە خزمەتی بیرۆکە بنچینەیەکە ناکات.

- نوسین بەرەنوسێکی ڕوون و ئاشکرا.

**٢.دەق و ڕێزمان:** بە خوێندنەوەیەکی خێرا چەند جارێك دەقەکە بەسەریەکەوە بخوێنەرەوە، ئینجا مانای وشەکان لێکبدەرەوە ئینجا مانای گشتی دەقەکە ئینجا خوێندنەوەی بەش بەشی دەقەکە، ئینجا لەبەرکردن، ئینجا ناوبەناو گوێ لە خۆگرتن.

**بنەماکانی ڕێزمان:** باشترین ڕێگە بۆ خوێندنەوەو سەعیکردن تیایدا بریتیە لە خۆ ڕاهێنان دوای تێگەیشتن لە یاساکە و زیادکردنی ئەم ڕاهێنانە، ئەتوانیت هەفتانە کاتژمێرێك تایبەت بکەیت بۆ پێداچوونەوەی ڕێکوپێکی یاساکانی ڕێزمان.

**شێوازی نووسین:** نووسین گرفتە چونکە ئەبێتە هۆی ڕوونکردنەوەو تێگەیشتن لەوەلامەکانت و زیادکردنی نمرە لەکاتی تاقیکردنەوەدا.

## زمانە بیگانەکان:

فێربوونی زمانە بیانیەکان پێویستی بەزیرەکی نیە بەئەندازەی ئەوەی پێویستی بەحەزو ئارەزووە، وێڕای شکاندنی ئەو هەستەی کە گوایە ئەو زمانە قورس و نارەحەتە، وەئەمەش لەگەڵ بوونی ڕاهێنانێکی

ڕێکوپێکداپێویستی بە جێبەجێکردنی ئەم هەنگاوانە هەیە:

* لەبەرکردنی وشە تازەکان بە خوێندنەوەو دەربڕینیان بەشێوەیەکی ڕاست، هەروەها زانینی ماناکانیان و حونجەکردنیان وە خۆت ڕابهێنە لەسەر بەکارهێنانیان لە ڕستەو دەستەواژەی تایبەتی خۆتدا.

* هەمیشە بە دەنگێکی بیستراو بیخوێنەرەوەو وەلامی هەموو ئەو پرسیارانە بدەرەوە کە ڕووبەڕووت دەبنەوەو تایبەتن بەو بابەتەی کە دەیخوێنیتەوە.

* دەربارەی ڕێزمانیش مەبەست لەبەرکردنی یاساکانی نیە، بەڵکو پێویستە قوتابی خوێندنەوەی نموونەکان دووبارەبکاتەوەو لێیان تێبگات و بەکاریان بهێنێت لە چەند ڕاهێنانێکیدا.

* هەندێ دەق یان کتێب بخوێنەرەوە کە گونجاوە لەگەڵ ئاستی زمانەوانیت لەو وانەیەدا.

***پێویستە لەکاتی نووسینی دارشتندا رەچاوی ئەم خاڵانە بکەیت:**

- ڕیزکردنی بیرۆکەکانت کە لەچەند بەش و پەرەگرافێکی ڕووندا بن.
- ڕەچاوکردنی یاساکانی ڕێزمان لە نووسینی ڕستەکانیدا.
- پێداچوونەوەی بابەتەکە دوای نووسینی.

**ماتماتیك:**

**١.ئەندازە:**

- بەخوێندنەوەی سەلمێنراوەکە دەست پێ بکە لەگەڵ ڕوونکردنەوەی دەقەکە بەوێنەو هێڵکاری.

- هەوڵبدە خۆت سەلماندنەکەی بکەیت دوای کێشانی وێنەکەی، دواتر هەوڵبدە دووبارە نموونەکان شیکار بکەیت بێ ئەوەی سەیری کتێبەکە بکەیت.

- دوای ئەوەی دڵنیابوویت کە بەتەواوی لە سەلمێنراوەکە تێگەیشتووی هەوڵبدە چەند ڕاهێنانێك لەسەر ئەو سەلمێنراوە شیکار بکەیت.

- بەجوانی بەو ڕاهێنانانەدا بچۆرەوە کە پێشتر شیکارت کردبوون وە هەوڵبدە شیکاریان بکەیتەوە جارێکی تر بۆ گێڕانەوەی زانیاریەکانت.

- ئینجا چەند پرسیارێکی تاقیکردنەوەی سالانی پێشوو شیکاربکە وە لە مامۆستاکەت بپرسە کاتێك شتێکی ناڕوونی تیابوو... باشتر وایە هەمیشە لەگەڵ هاوڕێ سەرکەوتوەکانت گفتوگۆ بکەیت لەسەر نموونە سەلمێنراوەکان.

- بەگەیشتنت بە شیکاری پرسیاری تاقیکردنەوەکانی پێشوو خۆشەویستیت بۆ وانەی ماتماتیك زیاد دەکات و یارمەتیت ئەدات لەسەرکەوتنت تیایداو هەمیشە بەرەو پێشەوە دەچیت.

## ٢.ژمێرباری و جەبر:

- پشتگوێ نەخستنی وانەکان و کەڵەکەنەکردنیان، خۆڕاهێنانی بەردەوام لەسەر شیکاری پرسیارو ڕاهێنانە جۆراوجۆرەکانی.

- داوای یارمەتی بکە لە مامۆستای وانەکەت کاتێك کە لە دەستورەکە تێناگەیت یان ناگەیت بەیاسایەکی گونجاو یان پرسیارەکە ئاڵۆزە.

**وانە زانستیەکان:**

* گرنگی بدە بە کۆکردنەوەی زانیاریەکانت لە ڕێگەی کتێبی تایبەتی ئەو وانەیەو مەلزەمەی بەشەکان و تاقیکردنەوە زانستیەکانەوە.

* تەنها جەخت لەسەر خوێندنەوەی سەلمێنراوەکان مەکە، بەڵکو ئەو بابەتەی کە دەیخوێنیتەوە کورتی بکەرەوەو وێنەو هێڵکاری پێویستی بۆ بکێشەو هاوکێشە تایبەتیەکانی بنووسە.

* کاتێك تاقیکردنەوەیەکی زانستی دەخوێنیتەوە لە خۆت بپرسە:

- بۆچی ئەم تاقیکردنەوەیە ئەنجام دەدرێت؟
- چ ئاڵۆزیەکی تیایە؟
- هەنگاوەکانی چین؟
- سەرنج و تێبینیەکانت چین لەسەری؟

بۆ ئەوەی وەڵامی تەواوت دەست بکەوێت، وا بزانە بۆ هاورێیەکت باسی دەکەیت کە هیچ دەربارەی نازانێ.

* پێویستە بایەخ بدەی بە تێگەیشتن و لەبەرکردنی پێناسە جیاوازەکان لەگەڵ گرنگی گرێدان و پەیوەستکردنەوەی هەموو پێناسەیەك بەیەکێك لە یاسا پەیوەندیدارەکانی بابەتەکە.

**تێبینی:**

تێبینــی ئــەوە کــراوە زۆربــەی ئــەو قوتابیانــەی کــە پشووی تەواو بەخۆیان نادەن لەشەوانی تاقیکردنــەوەدا بــە تایبــەتی لـــە تاقیکردنــەوەی بابەتــە زانســتیەکان و ماتماتیکدا، نمرەی زۆر لە کیس خۆیــان دەدەن بــەهۆی ئـــەو هەلآنـــەی تووشـــیان دەبێـــت لـــە ئـــەنجامی ماندوویەتیانەوە.

ئــەم تێبینــە ئاگادارمــان ئەکاتــەوە لەســەر ئــەوەی سووربین لەسەر رێکخستنی خوێندنەوەو دوورکەوتنەوە لەشەونخونی لەشەوی تاقیکردنەوەدا، بۆ ئــەوەی هــزرو مێشکمان ساف بێت و ماندو و هــیلاك نــەبین تــابتوانین ئەنجامی ڕاستمان دەست بکەوێت لەو جۆرە وانانەدا.

**بابەتە کۆمەڵایەتیەکان:**

*زۆربەی قوتابیان وا هەوست دەکـەن خوێندنـەوەو سـەعیکردن لـە بابەتـە کۆمەڵایەتیەکانـدا بریتیـە لەلەبەرکردن بێ تێگەیشتن، ئەمەش زۆر هەڵەیە، چونکە لە ڕاستیدا خوێندنەوەی ئەم وانانە پێویستی بە تێگەیشتن و پێکەوە بەسـتنی بابەتـەکان و بـەکارهێنانی ئەندێشـەو شیکارو دەرەنجام هەیە، لەکاتی خوێندنەوەی ئەم جـۆرە ماددانە ڕەچاوی ئەم خالانە بکە:

١ – دابەشکردنی هەر مادەیەکی کۆمەڵایەتی ( مێژوو – جوگرافیـا) بەسـەر بەنـد دابەشـبکە هەریـەکێکیان چەمکێك، یان بابەتێکی تـەواوی تیابێـت، وە واباشـترە بەسەریەکەوە بخوێنرێتەوە.

٢– ئەم بەشە بەگشتی بە خوێندنەوەیـەکی خێراوبـە تێگەیشتنەوە بخوێنەرەوە، ئینجا جارێکی تر بیخوێنەرەوە

بۆ ئەوەی سەرنجی پێکهێنەرە بنچینەییەکان بدەی، دواتر کتێبەکە دابخەو هەوڵبدە پێکهێنەرەکانی ئـەو بابەتـە بـیر خۆت بهێنیتەوە، لـە بـیرت نەچـێت سـەیری کتێبەکـە بکەرەوە بۆ دڵنیابوونت لە ڕاستی خوێندنەوەکەت.

٣- نەخشـــە بەکاربهێنـــە، هـــەموو نـــاو و ڕوونکردنـــەوەکانی لەســـەر دیـــاری بکـــە، هەوڵبـــدە نەخشەکە بەدەستی خۆت بکێشی.

## ئەو هەڵانەی کە تووشی زۆرێـک لـە قوتابیـان دەبن لەکاتی تاقیکردنەوەکاندا:

١- تێنەگەیشتنی پێویست لە پرسیارەکە: لەبەر ئەوە باشتر وایە پرسـیارەکە زیـاد لـە جارێـك بخوێنیتـەوە و داواکـراو دیـاری بکـەیت، سـەرەڕای دیـاریکردنی خاڵـەکان بـۆ نووسـینیان لـە وەڵامـدا بـە شـێوەیەکی ڕێکوپێك.

٢- وەڵامدانەوەی پرسیارەکان بەشێوەی دارِشتن بە تایبەتی لە ماددە کۆمەڵایەتیەکاندا، هەربۆیە زۆرێك قوتابیان نمرەی زۆریان لە کیس دەچێت، چونکە مامۆستا بەدوای وەڵامی دیاریکراو بە خاڵی سەرەکی دەگەرِێ، کە داواکراوە لە پرسیارەکەدا.

٣- خۆرِانەهێنان لەسەر نەخشەکردن و دیاریکردنی پێویستییەکانی لەسەری، بۆیە دەبینین زۆربەی قوتابیان ئەو بۆچوونەیان لای خۆیان دروستکردووە کە ناتوانن هێڵکاری ئەو نەخشانە بکەن کە پێویستە بکرێن، کە ئەمەش وایان لێ دەکات تەنها جارێکیش هەوڵی دروستکردنی نادەن.

**ڕۆڵی خێزان لە وەرزی تاقیکرنەوەکاندا:**

١- دابینکردنی کەشێکی هێمن و لەبار لەماڵەوە.

٢- چاودێری‌کردنی سەعیکردنی قوتابی لە کاتی تاقیکردنەوەکاندا.

٣- گرنگی دان بە خۆراکی چاك و خەوی ئارام چونکە لە هۆکارە تەندروستە باشەکانن وە توانای سەعیکردن ئەبەخشن،سەرەڕای زۆر نەخواردنەوەی چا و قاوە.

٤- ڕێگە خۆشکردن بۆ خوێندکار بۆگەیشتنە قوتابخانە پێش کاتی تاقیکردنەوە بە کاتێکی گونجاوو گەڕانەوە بۆ ماڵەوە لەکاتی دیاریکراودا.

٥- دڵنیاکردنەوەی خوێندکار لەسەر ئامادەکردن و هەڵگرتنی هەموو پێداویستیەکانی تاقیکردنەوە.

٦- ڕانەسپاردنی قوتابی بە ئەنجامدانی هیچ کارێك لە ماڵەوە لە کاتی تاقیکردنەوەدا.

٧- دوور کەوتنەوە لە میوانداریی‌یە کۆمەڵایەتیەکان چ بە پێشوازیکردن یان بەشداریکردن و ئامادەبوون لەو کاتانەدا ( پێش تاقیکردنەوەکان).

## بەگشتیی پرسیارەکان پێنج جۆری سەرەکین:

ڕاست وهەڵە، هەڵبژاردن، بۆشایی، وەلامی کورت، وەلامی درێژ لەسەر شێوەی وتار.

لێرەدا پێویستە بزانیت:

١ چاو خشاندنەوەی خێرا بەسەر پرسیارەکاندا بەتەواوی یارمەتیت ئەدات لە دیاریکردنی کاتی پێویست بۆ وەلامدانەوەی هەر پرسیارێك.

٢ لەپێشدا پرسیارە درێژەکان بخوێنەرەوە.. پێش ئەوەی وەلامی هیچ بەشێك بدەیتەوە.هەروەها کاتێك

کە وەلامی پرسیارەکانی تر نەدەیتەوە ئەو بیرۆکەو دەستەواژانە بە کورتی بنووسە کە بەگونجاوی دەزانی بۆ پرسیارە درێژەکان.

٣- هەر پرسیارێك کە تووشی کێشەت دەکات بیپەڕێنە؛ ئەتوانی دواتر بگەڕێیتەوە سەری لەوانەیە پرسیارێکی تر یارمەتیت بدات لەبەبیرهاتنەوەی وەلامەکەی.

٤- پرسیاری ڕاست و هەڵە و هەڵبژاردنەکان زۆربەی جار ئاسانن لەبەرئەوە یەکەمجار وەلامی ئەم پرسیارانە بدەرەوە پێش پرسیارەکانی تر ئەگەر توانرا. لەوانەیە ئەم جۆرە پرسیارانە یارمەتیت بدەن لەسەر بەبیرهاتنەوەی وەلامی بۆشاییەکان هەروەها بیرۆکەت ئەدەنێ لەسەر ( پرسیارە درێژەکان )

٥- وەلامێکی خەملێنراوی باش چاکترە لە بەجێهێشتنی لاپەڕەکە بە سپێتی، لەوانەیە هەندێ نمرە بەدەست بهێنی...هەوڵی ڕازاندنەوەی وەلامە خەملێنراوەکەت مەدە.

٦- وەلامە کورتەکانت لە ڕستەی ئاسان و ڕووندا بنووسە... دەستنیشانکردنی وەلام و زانیاریە ڕاستەکەت گرنگترە لە ڕازاندنەوەی ئەدەبی.

٧- پرسیارە درێژەکان توانای بیرکردنەوەی قوتابی تاقیدەکاتەوە... بەستنەوەی بیرۆکەکان لە بابەتەکەداو زانیاریە ڕاستەکان گرنگە، بەلام خستنە ڕووی لە چوارچێوەیەکی ڕێکوپێکو پێکەوەبەستراو دیسان گرنگە.

**ئەمانەش چەند ئامۆژگاریەکن لەسەر وەڵامدانەوەی ئەم جۆرە پرسیارانە:**

أ- بە نووسینی زانیاریەکان دەست پێ بکە لەسەر لاپەڕەیەکی سپی وەك( پێناسەو زاراوە گرنگەکان کە ناتەوێ لە بیرت بچنەوە).

ب- هەر پرسیارێکی درێژە بە وردی بخوێنەرەوە پێش وەڵامدانەوەی... وەزۆربەی جار پرسیاری ئارەزوومەندانە ( إختیاری) هەیە.. هەمیشە ئەو پرسیارە وەڵام بدەرەوە کە ئامادەی بەشێوەیەکی وردو ڕێکو پێك وەڵامی بدەیتەوە.. وەکاتی پێویست بۆ پرسیارەکە دیاری بکە.

ج- وەڵامەکەت بەڕستەی مانادار لەسەر بیرۆکەی بنچینەیی بابەتەکە دەست پێ بکە. بەشی یەکەم هێلکاری بەشەکانی داهاتوو پێشکەش دەکات

لەڕێگەی باسکردنی خاڵە بنەڕەتیەکانەوە.. دوای ئـەوە درێژە بدە بە ڕوونکردنـەوەو باسـکردنی هـەر خاڵێـك بەپێی پێویست.

د- جـەخت بکـەرەوە لەسـەر خاڵـە بنەڕەتیـەکان لەوەڵامەکەتـدا.خاڵـە بنەڕەتیـەکان بەکاربهێنـە بـۆ دەستپێکردنی ڕستەکە... لە تەنها ڕستەیەکدا زیـاتر لـە خاڵێك باس مەکە. ئامڕازەکانی پەیوەندی و ژماردن بۆ پێکەوەبەستنی بیرۆکەکانت بەکاربهێنە.

هـ- وەڵامە کۆتاییەکانت بە کۆتاییەکی بەپێز کۆتایی پێ بهێنە. ئەتوانی بیرۆکە بنەڕەتیەکە جـارێکی تـر بـاس بکەیتەوە و وە ڕوونکردنەوەی هۆکاری گرنگیەکـەی ڕوون بکەیتەوە.

و- دیسان بە تیانووسەکەتدا بچۆرەوە بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەکانی نووسین وەدڵنیا بونت لە ئاسانی خوێندنەوەی.

ع- ئەگەر کات کەم بوو... وەڵامەکانت لە دەستەواژەی کورت و مانادار تۆماربکە.

بە ئومێدی سوودمەندبوون لەم بابەتەو لە ڕێنماییەکانی.




کۆمەڵەی ئارا
بۆ توێژینەوەی زانستی
بەشی ڕۆشنبیری
-6-

## لەم زنجیرەیەدا

1- ئامادەکردنی توێژینەوەی زانستی
2- کلیلی زانست وزانیاری
3- الاملاء الوافي - بەعەرەبی
4- بەرەو کۆشش کردنێکی باشتر
5- فیربونی (STAAD. pro)
6- سەرکەوتنت پیرۆزە

ژمارەی سپاردن : ٣٩٠ ی ساڵی ٢٠٠٦